یارم گوڵ نیە ئەو گوڵزارێکە
بۆ خۆی بەتەنها چوون بەهارێکە
سەرم سووڕماوە لە کاری یارم
بۆ گوڵ ئەفرۆشێ ؟ عەجەب کارێکە

له مێژە خاوەن ئەو ئێش و زامەین
ئێستاش نازانین بۆ خۆمان کامەین
زەردین یان سەوزین سۆرین یان مۆرین
بە دەستیانەوە وەک داشی دامەین

پزیشک پێی ووتم بۆ بێ خەبەری ؟
دڵت بچووکەو تەنگە ڕووبەری
پێویستە جێگای یار فراوان بێت
ئەبێ گەورەی کەین بە نەشتەرگەری

دوو کەس لە دنیا بەشیان تەواوە
ئەگەر وا نەبیت مافت خوراوە
یەکیان کۆیلەیەو مەسینە هەڵگر
ئەوی تریشیان ئیشی ماستاوە

هەر کە گەورە بووم وێرانە ماڵ بووم
ئاوێتەی خەم و ژینێکی تاڵ بووم
هیچ کات مەپرسن تەمەنت چەندە
هێندە ژیاوم کەوا مناڵ بووم

وا تەمەن بەرەو کۆتا ساڵی یە
بە جێی ئەهێڵم ئەم جەنجاڵی یە
ئەی خاک بەسەر خۆم بۆ ڕێی سەفەرم
ئامادە نیم و تێشووم خاڵی یە

کەسێ سەربەرزە سەردانەوێنێ
بەندایەتی خۆی بۆ خوا بنوێنێ
یەکێ گەورەیە خۆی پێ بچووک بێ
سادەو خاکی بێت کەس نەڕەنجێنێ

تەمەنمان وێنەی گەڵای پاییزە
دڵ بۆ وەرینی خەمگین و زیزە
بەڵام نازانم ئەم گەڵایانە
ساڵ مەرگی منە یان هی ئازیزە؟

قەت مەڵێ لاوم مردن گشت گیرە
بۆ داراو نەدار بۆ پیرو ژیرە
کام گۆڕستانە کە لێی نوسراوە ؟
ئەم ئارامگایە تەنها بۆ پیرە ؟

چەرخی زەمانە تەمەنی کەمە
لەو کەم کەمەیە ئەم کەمەی هەمە
ئەم عومرەی هەمە بەشی چی دەکا ؟
بە هیچ ڕا ناگا هەمووی بۆ خەمە

مردنی ڕاوچی هەمووی لە بیرە
تەڵەو داوەکەی بۆ پیرو ژیرە
سەیر لەوە دایە لە ڕۆژی دوایی
ڕاوچی ڕاوچێکان بۆخۆی نـێچیرە

سەیری مرۆڤ کەن چەن بێ ئاگایە
سەرقاڵی بەزم و ڕەزمی دنیایە
بیر ناکاتەوە مردن لە ڕێ یە
بۆ نان و کورسی لە هەڵپەدایە

ئەوەی دوو ڕوو بێت هەم درۆزنە
دایم خەریکی چاڵ هەڵکەندنە
هەرگیز هاوڕێتی کەسی وا مەکە
ئەمڕۆ دۆستت بێ سبەی دوژمنە

بڕوانە ئێمەی ئادەمی چۆنین
مایل بە سەوزی و گوڵزارو بۆنین
چونکە دەسپێکی ژینمان بەهەشتە
دایم تامەزرۆی هەواری کۆنین

زەکات بەخشینی ماڵ و سامانە
ماچی لێویشت زەکاتی گیانە
مەپرسە بۆ کێ هەر بە من دەشێ
گەلێ هەژارم وەرە بڕوانە

شێوەی ڕووخسارت وەک گوڵ خەمڵیوە
جوانی بە جارێ لەشتی تەنیوە
سەراپای باڵات دوڕڕ و مەرجانە
تۆ کەی پێویستت بە زێڕو زیوە ؟

ژیانی دنیا وەک خوێندنگایە
تاقی کردنەوەو وانەی تێدایە
ئەگەر خوێندکارێ باش و زیرەک بی
پاداشتی گەورەت لە لای خودایە

شانازی بکە ئادەمیزادی
خوا خەلقی کردووی حوڕڕ و ئازادی
ئیتر بۆ مەیلت لە ژێر دەستی یە ؟
بە کۆیلایەتی دڵخۆش و شادی

سەرچاوەی بوونی ئەو لەش و تەنە
دڵۆپێ ئاوی لیق و بۆگەنە
بۆچی ئەوەندە خۆت پێ گەورەیە؟
کە خۆت ئەزانی نرخەکەت چەنە

تۆ لە کڕنۆشا زۆر بە نهێنی
بە گوێی زەویدا سووک ئەچرپێنی
بەڵام پاداشتت ئاشکراو ڕوونە
ڕەزامەندی خوا بە دەست ئەهێنی

مرۆڤ ئەو کاتەی زار دەجووڵێنێ
ناخی چی تیابێ ئەوە دەردێنێ
نموونەی ناخی دێتە سەر زاری
بەبێ ئاگایی خۆی دە ناسێنێ

لەگەڵ خەڵکیدا بە گڕو تین بە
دڵ ساف و بێ فێڵ بێ ڕق و قین بە
خۆ تۆ مرۆڤی گۆشتت ناخورێ
کەمێ ڕووح سووک و زمان شیرین بە

ئەم ماندوو بوون و هەڵپە کردنە
ئەم چاو برسێتی و بێنەو بردنە
لە لات وا نەبێ کە بۆ ژیان بێ
تەنها پێشبڕکێی بەرەو مردنە

تازە بە تازە چاو لە دەر بوومە
بۆ سێوی سینەت سەوداسەر بوومە
نەکەی بۆ سێوێ وەدەرم بنێی
چونکە جارێ تر دەربەدەر بوومە

کۆڵێ گوناهی لە شانی بارە
لە مرۆڤ ناچێ هێندە بەدکارە
کەچی هەرچاوی لەسەر خەڵکیە
تاکو بزانێ کێ خەتا بارە

مرۆڤ گەورەیە خۆت زەلیل مەکە
حەزو ئارەزووت کۆت و دیل مەکە
ئەو نیعمەتانەی خودا پێی داوی
بۆچی لێی ناخۆی ؟ خۆت ڕەزیل مەکە

کاتی مردن و کۆتا دیدارت
هەموو لە گەڵتن تا دوا هەوارت
ئیتر لەوێدا بە جێت ئەهێڵن
بێ کەس و سامان خۆت و کردارت

نیوتن به سێوێک بەبێ سەرئێشە
بەیەک کەوتنێک زانی کە کێشە
ئێمەی نا حاڵیش سەدجار بکەوین
پەند وەر ناگرین ئەمەیە کێشە

هەندێ کەس چونکە ژیانی تاڵە
بەڕووکەش پیرەو بۆ خۆی کەم ساڵە
تەمەن درۆیە هەر ژمارەیە
پیر بە ساڵ نیە بەڵکو بە حاڵە

ڕژدو ڕەزیل بووی تۆ هەتاکو بووت
چاوت نەی ئەدی خەڵکی ڕەش و ڕووت
کۆشک و تەلارو پارەو پوول پەشمە
دوا مەنزڵی تۆ تابووتە تابووت

ژیانی دنیا چەن ناوازەیە
چۆنی پێ خۆش بێ ئەو ئاوازەیە
لە لایەک بە دار لانکەی پێ ئەکەن
لە لایەکی تر دارە بازەیە

که تۆ ئێستاکە خاوەن ڕۆزێکی
خۆت پێ گەورەیەو کەچی تۆزێکی
تۆ لە ئادەمی و سەرچاوەت خۆڵە
کە وایە هیچ نیت تەپوو تۆزێکی